بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيم

ناسنامەی نامیلکە

---

**ناوی نامیلکە: پێشەکیەک بۆ ئاشنا بوون بە خیر القرون**

**نوسین و ئامادەکردنی: کاروان کمال الکردي**

**ژمارەی پەڕە: ١٧**

**ساڵ: ١٤٤٣ھ**

---

ناونیشانی کەناڵ لە تەلەگرام

https://t.me/karwankamall1

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آل و أصحابه أما بعد:

لێم دەپرسن( خير القرون ) کێیە ؟ بەکێ دەڵێن ؟

لەوەڵامی ئەو داواکاریەی خوێنەر بەڕێز دەڵێم:

بزانن ڕەحمەتی الله تعالی برژێ بەسەرتان وەک چۆن سەلەف زۆرێک لە کتێب و نامیلکەکانیان لەپێناو داواکاری کەسانی دەوروبەریان بووە ، نەک بەوەی نەزان بن بەڵکو بۆئەوەی زیاتر لایان ڕوون بێت ، وەک نامیلکەی شرح السنة للمزني کە لە پێشەکی دا ئاماژەی پێدەدا وە ڕەددی جەهمیەکان لەلایەن پێشەوایانی سەلەف زۆرینەی لەم پێناوە بووە ، منیش لەم پێناوە بۆ خوێنەری خەمخۆری دین و ئەوانەی تامەزرۆی فێربوون و زانینن، بۆئەوەی تێبگەن و پێبگەن ، وە بۆ ئەوەی هیچ نەبێت کەمێک لە سەر سێ باشترین سەدەکانی مێژووی ئیسلام بزانێت ،

چونکە ئەوان چرای ڕێگای هەموو سەدەکانی ترن بەگەڕانەوەت بۆ لای ئەوان زیاتر و زۆر تر نزیکتر دەبیتەوە لەحەق ، بەپێچەوانەوە دوورکەوتنەوەت دەبێت بە هۆی دوورکەوتنەوە لەحەق ، بەبەڵگەی فەرموودەی ( هیچ سەردەمێک نیە ئیللا ئەوەی دابێت دوای ئەو زۆر خەراپترە لەو ) کەواتە ساڵ دوای ساڵ و سەدە دوای سەدە ئێمە خەراپتر و خەراپتر بووین ، تاوەکو ئەوەی ئەمڕۆ کە ئەیبینن خەراپترین سەدەو سەردەمی مێژووی ئیسلام کە خۆری بەسەردا هەڵاتبێ ئێستایە ،

پێویستە تۆی خوێنەری بەڕێز لەوە بگەیت ئامانجی من بۆ ئەوەنیە تاوەکو شەخست لا پیرۆز و گەورە بکەم ، چونکە تێکڕایی ئەو زاناو پێشەواو پێشەنگ و ئیمامانەی کەوا باسیان دەکەم بۆتان هیچ یەکێکیان بەخەڵکی نەگوتوە شوێن من یان فلان کەس بکەون ، بەڵکو بەپێچەوانەوە ، هانی خەڵک و قوتابییەکانی خۆیان داوە بەوەی مقلدی هیچ کەس نەبن وەك قەولی مشهوری ئیمام ئەحمد کە دەڵێت : ( لا تقلدني ولا تقلد مالكاً ولا الشافعي ولا الأوزاعي ولا الثوري، وخذ من حيث أخذوا ) وە تەنانەت فەرموودەی لاوازیان زۆر لە ڕەئی پێ باشتر بووە ،

بەڵام ئەوەش واتایی ئەوە نیە هەریەکەو لەئاست خۆیەوە ببێتە بە موفتی و فەتوا بداو چۆنی بوێت بە پێی عەقڵی خۆی دین وەربگرێ نەخێر نابێت بەڵام دەبێت لە ئەهلی علم و خشوع خضوع بپرسیت چونکە الله سبحان وتعال پێمان دەفەرموێ:

(فسألوا أهل الذكر إن كنتم لا تعلمون ) کە لەبارەی ئەم ئایەتەوە هەندێک دەڵێن واتا ئەهلی تەوڕات و ئینجیل وە هەندێک دەڵێن قورئان وە هەندێك دەڵێن فوقەهاء ،

لەهەموو حاڵەکان گەڕانەوەیە بۆ ئەهلی خیبرە وشارەزا لەدین

گەرنا تێ دەچین بەرەو گومڕایی ،

وە بەبەڵگەی فەرموودە کەوا (علم واتە علماء ) رەسولی سەردار ﷺ دەفەرموێ ( خوای تعالی ڕاستەوخۆ علم لەخەڵك ناگرێتەوە بەڵکو زانایان ناو ناهێڵێت تاوەکو خەڵک کەسانی نەفام و نەزان دەکەن پێشەواو پرسیاریان لێدەکەن ئەوانیش بێ علم وەڵام دەدەنەوەو خۆیان و خەڵکیش گومڕا دەکەن ) کەواتە ( زانا) واتە ( علم)

وە لە فەرموودەیەک هاتووە ( العلماء ورثة الأنبياء ) بەڵام لەڕووی سەنەدەوە (لاوازە گەرچی ئیمام البخاري لە (كتاب العلم ) بە معلق

هێناویەتی هەریەک لە أبو داود و الترمذي بەهەمان شێوە ، ئەگەر لاوازیش بێت ئەصلێکی هەیە لە ڕیوایەتی تر ، بۆیە ئیمام بخاري لە کتابی العلم هێناویەتی کەواتە بەپێی هەموو بەڵگەکان علم واتە دین دینیش کۆبۆتەوە لە ئەهلی علم ،

باشترين وچاكترين وپاكترين ئەهلی علم يش بريتين لە

(خير القرون ) كەواتە لەپێناو علم و دين پێويستە تۆی خوێنەر بيانناسيت وە بزانيت كێن و كێ نەبوون ،

لێرەدا من هەموو باسەكەم بەشێوەی پێشەكيەک لەسەرەتاوە تاوەكو كۆتايی خستۆتە ڕوو تەنها بە پووختی وەكورتی ناوی زۆر ترين زاناو پێشەنگەكانم هێناوە ،
داواكارم الله لێمان قبوڵ كات.

# چینی یەکەم هاوەڵان:

لە  فەرموودەی صەحیح هاتووە بەمشێوە:

عَنْ عَبْدِ الله بن مسعود "، عَنِ النَّبِيِّ ! قَالَ: (خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ). مسلم

لە عبدالله بن مسعودەوە "، دەڵێت رسول الله ! فەرمووی: باشترین و چاکترین سەدە سەردەمی منە، ئنجا دوای ئەو و ئنجا دوای ئەو.

هەروەها لە عمران بن حصين ەوە گووتی : قال رسول الله (خير أمتي قرني، ثم الذي يلونهم، ثم الذين يلونهم). قال عمران: فلا أدري أذكر بعد قرنه قرنين أو ثلاثًا.

عمران بن حصين دەڵێت: رسول الله فەرمووی چاکترینی خەڵک سەردەمی منە، ئنجا دوای ئەو و دوای ئەو.

عمران" دەڵێت: نازانم دوای سەدەی ئەو دوو سەدەی گووت یان سێ سەدە".

یەکەم سەدە و سەردەم  سەدەی هاوەڵان بوو،واتە ئەو سەردەمەی کە پێغەمبەر ﷺ خۆی تێیدا بووە تاوەکو وەفاتی وە دوای وەفاتی تاوەکو کۆتا چین و کەس لەنێو هاوەڵاندا دەگرێتەوە ،

دواتر سەدەی( التابعين ) و دواتر سەدەی( أتباع التابعين )واتە چینی دوای هاوەڵان و دوای ئەوان. ئەمانە ئەم سێ چینەن کە رسول الله ! شاهێدی چاکی بۆ داون.

هەروەها خوای تعالى لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (100) التوبة.

## بەشێک لە ناوی هاوەڵە بەڕێزەکان یان زانایانی نێو هاوەڵان:

أبو بكر الصديق و عمر بن الخطاب و عثمان بن عفان و علي بن أبي طالب الله لە هەر چواریان ڕازی بوو. واتە (خلفاء الراشدين)ن. هەروەها فەرموودەش هەیە لە رسول الله ! ەوە: (عليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين). رواه أبو داود في سننه.

ئیمامی أبو بكر تەنیا دووساڵ دوای وەفاتی پێغەمبەر مایەوە. دواتر عمری کوری خەتاب زیاتر لە دە ساڵ خەلافەتی کرد و، زۆرترین فتوحاتیش لەسەردەمی ئەودا ڕوویدا. دواتر شەهیدکرا و، دوای ئەو عثمان بن العفان هاتە سەر حوکم. ئەمیش ساڵانێکی زۆر خەلافەتی کرد و، دواتر شەهیدکرا و شەهیدبوونی ئیمامی عثمان گەورەترین فیتنەی نێو ئیسلامی هەڵقووڵاند ، تا بووە هۆی دابەشبوونی هاوەڵان بەسەر دوو بەرەدا،

بەرەی معاوية بن أبي سفيان و دایکمان عائیشة ، هەروەها بەرەی ئیمامی علي و عمار بن یاسر تاوای لێهات چەندان شەڕی خوێناوی لەنێوانیان دروست بوو. هەربۆیە رسول الله ! بە یەکێک لە فیتنە گەورەکان وەسفی کرد و بە یەکێکیش لەنیشانەکانی پێش قیامەت.

ئینجا (ئەوانەی ماون لە عشرة المبشرة)وە ئەو چوار خەلیفە لەڕێزبەندی دە موژدە پێدراوەکانن ، بەڵام ڕاستر وایە بڵێین ئەهلی ڕاوێژ پێکردن لەدوای ئەوان بریتی بوون لە:

سعد بن أبي وقاص و الزبير بن العوام و عبدالرحمن بن عوف و أبو عبيدة بن ) الجراح، الله لە هەموویان ڕازی بێتن ئەهلی شورابوون ئەمانە.

ئینجا هەر لەنێو هاوەڵان (قرآئەکان ) چوار بوون کە لە فەرموودەی صەحیح موسلیمدا هاتووە رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (خذوا القرآن من أربع عبدالله بن مسعود، سالم مولی أبي حذيفة، أبی بن کعب، زيد بن الثابت). ئەو چوار هاوەڵە بەڕێزە رسول الله تايبەتی کردوون بۆیە تاوەکو ئەوان لەژیاندا بوون زیرەکترینی نێو هاوەڵان بوون لە و بوارەدابەتایبەت( أبن مسعود ) رضي الله عنه کە یەکێکە لەزاناترینی نێو هاوەڵان بە قورئان تەنانەت لە صەحیحی البخاري و موسليم دا هاتووە خۆی دەڵێت: (هاوڕێیانم دەزانن کە من شارەزاترینم بەقورئان، گەر بزانم یەکێک هەبێت لە من شارەزاتر ئەوا دەچمە خزمەتی، ئینجا لە ساڵی( سییەکانی) هیجری وەفاتی کردووە.

هەروەها ( عبدالله بن عباس ) کە بە ( حبر البحر ) ناسراو بوو

بەهۆی بەرەکەتی دوعای پێغەمبەر بۆی ( اللهم علمه الكتاب يان اللهم فقه في الدين وعلمه التأويل)

بۆیە عبدالله بن مسعود کاتێ لەژیان بوو دەیفەرمووە ابن عباس:

(نعمة ترجمان القرآن ) واتە لە تەفسیر وێنەی نەبووە ، بۆیە بەشێک لە پێشەوایانی سەلەف پێش ابن مسعودی دەخەن بەهۆی ئەوەی (٣٠ ) ساڵ زیاتر دوای ابن مسعود وەفاتی کردووە وەک ئیمامی ئەحمد.

دواتر فوقەها و عولەمائی نێو (صغار الصحابة)، وەک:

(عبدالله بن عمرو و عبدالله بن الزبير وأنس بن مالک ). ئەمانە بەشێکن لە عیلم لە ئیسلامدا

هەروەها حافظ ترین هاوەڵ ئەبو هريرة رضی الله عنه بووە.

گەرچی لە ساڵی فتحی خەیبەر دا موسڵمان بوو واتە بەماوەیەکی کەم لەخزمەت ڕەسولی سەروەر ﷺ زۆرترین فەرموودەی لەبەر کرد وە زۆر ترینی لێوە گێڕاوە گەرچی ڕووبەڕووی گلەیی هاوەڵە بەڕێزەکانی تر بۆتەوە بەوەی زۆر فەرموودە باسدەکات ، چونکە هاوەڵان بەهۆی ترسیان لەفەرموودەی ( من كذب علي متعمدا ... ) نەدەگێڕاوە کە لە کتابی (الجرح والتعديل ) دا بە ووردی باسی ئەو خاڵەم کردووە.

دواتر( عبدالله بن عمرو و جابر بن عبدالله و أبو سعيد الخدري ) يە. هەروەها هەریەک لە عبدالله بن عمر و جابر بن عبدالله و ئەبو سعيد الخدری و عبدالله بن عباس، ئەمانە لە ساڵەکانی حەفتای هیجری وەفاتیان کردووە. هەروەها دایکمان( عائیشة ) الله لە خۆی و باوکی ڕازی بێتن کە ڕازی بوو، بەشێکە لە عیلم لەدیندا تەنانەت زۆرینەی زۆری هاوەڵان بە گەورە و بچووکەوە دەچوون پرسیاریان لە عائیشە دەکرد.

جگە لەوانەی سەرەوە کە بە تسلسل پێدا هاتم کۆمەڵێکی لە هاوەڵی بەڕێزی تر هەبوون کەوا ئیمام و پێشەوا بوون وە خاوەن علم بوون کە هەندێکیان لە السابقين وە هەندێکیان دوای ئەوان ئەوانیش هەریەك لە:

زيد بن ثابت، وأبو الدرداء، وعبادة بن الصامت، وأبو موسى الأشعري، وعمران بن حصين، وعمار بن ياسر، وحذيفة بن‌اليمان، وعقبة بن عامر الجهني، وسلمان، وحذيفة بن أسيد الغفاري، وأبو أمامة صدي بن عجلان، وجندب بن عبد الله، وأبو مسعود عقبة بن عمرو وعمير بن حبيب بن خماشة، وأبو الطفيل عامر بن واثلة ، وأم سلمة - رضي الله عنهم أجمعين.

ئەمە کورتەیەک بوو لە زاناو داناکانی نێو هاوەڵان نەك باشترین و چاکترین چونکە دەیان پلە بەرزی هاوەڵان هەبوون کەوا کەمتر قسەیان لەدیندا کردووە.

# چینی دووەم و سێیەم سەدەی التابعين (تابعي مؤمن)

ئەو چینەیە کەوا رسول الله ﷺ شاهێدی چاکی بۆیان داوە، واتە چینێکن دوای هاوەڵان باشترینن ئەمانە دوای وەفاتی پێغەمبەر دەست پێدەکات واتە ئەویان نەبینیووە، بەڵام هاوەڵانیان بینیووە. بێگومان وەک چۆن لە نێو هاوەڵان کۆمەڵێکی دیار هەبوون دانا و زانابوون، بەهەمان شێوە لەنێو ئەم چینەشدا کۆمەڵێکن کە کاریگەربوون و عالمترین بوون.

دەمەوێت ناوی هەندێکیان ئاماژە پێ بدەم بۆ شارەزابوون و ناسینی زاناو پێشەوا دیارەکانیان ئەوانیش:

## لەنێو زانایانی تابعین لە مەدینەدا بریتی بوون لە:

سعيد بن المسيب کە بە (عالم أهل المدينة ) ناسرابوو فەقیهـ و دانا بوو هاو سەردەمی پێشەوا ( حسن ) بوو وە یەکێک بوو لە ( فقهاء السبعة )کە علم لەدەوریان دا بوو ، وە عروة بن الزبير بن العوام ، کوڕی هاوەڵی حواري رسول الزبير ، بەهەمان شێوەی سعيد بن المسيب عالم وە دانا بوو بەهۆی نزیکی لە دایکی ئیمانداران عائشة وە کە پوری بوو زۆر ترین علمی لەو وەر گرت بەجۆرێک زۆر ترین ڕیوایەتی لێوە کردووە ، عروة جگە لەعلم لە زوهد و عیبادەتیش لە لووتکە کە لە نامیلکەیەکی تایبەت باسی ورع و تەقوای ئەو ئیمامەم کردووە بەناوی ( عیبادەتی خير القرون ) وەالقاسم بن محمد بنأبي بكر، وسالم بن عبد الله بن عمر کە کوڕی هاوەڵی بەڕێز( ابن عمره ) و نەوەی ئیمامی عمر بوو دوای ( نافع ) زۆر ترین ڕیوایەتی لەباوکی کردیە وە سليمان بن يسار، وەمحمد بن الحنفية، وعلي بن الحسين بن علي، وابنه محمد بن علي بن حسين، وعمر بن عبد العزيز، وكعب بن ماتع الأحبار و زيد بن أسلم ئەوانە پێشەوایانی نێو گەورە تابعین

بوون نەک عابدترینەکان چونکە تابعی بەڕێزی وا هەیە کە ناسراو نیە بەڵام لە عیبادەت لە لووتکە بووە.

ئینجا هەر لە مەدینە لە چینی دواتر یان دووەم وە بچووکتر لەوانەی سەرەوە کۆمەڵێک لە پێشەوای دیاری نێو یان بریتی بوون لە:

محمد بن مسلم الزهريیان ابن شهاب الزهري ، یەکێک بوو لە پێشەنگ و پێشەوایانی سەلەف وە یەکێک بوو لە حافظ ترینیان وە یەکێک بوو لەوانەی علي ابن المديني گووتیەتی : سەنەد لەدەوری کۆبۆتەوە وە ربيعة بن أبي عبد الرحمن، وەعبد الله بن يزيد بن هرمز، وە زيد بن علي بن الحسين، وەعبد الله بن حسن، وەجعفر بن محمد الصادق.

ئینجا چینی دوای ئەوان هەرلە نێو ئەهلی مەدینە دا لەناو دارترین و عالم ترینیان بریتی بوون لە:

أبو عبد الله مالك بن أنس یان ئیمامی مالك سەردار و پێشەنگ و پێشەوایی چینی نێو گەورە أتباع التابعين ، وەعبد العزيز بن أبي سلمة الماجشون. وە دواتر عبد الملك بن عبد العزيز، وإسماعيل بن أبي أويس، وأبو مصعب أحمد بن أبي بكر الزهري وە يحيى بن أبي كثير اليمامي.

ئەوانە پێکهاتەی ناوی ئەو پێشەواو پێشەنگانەی خير القرون بوون لەناو دارترینەکانیان وە لەدیار ترینەکانیان لە خەڵکی مەدینە دا

## لە نێو زاناو پێشەوا دیارەکانی ئەهلی مکە بریتی بوون لە:

عطاء بن أبي رباح یەکێکە لە پێشەوا هەرە دیارەکانی سەردەمی تابعین بە ( مفتي مكة ) دانرابوو لەعلم و زوهد پێشەنگ بوو ،

وەئیمامی طاوس بن کیسان ، وە ئیمامی مجاهد بن جبر یەکێک لە دیار ترین زانایانی سەلەف و قوتابی ابن عباس و پێشەنگ لە تەفسیری قورئان ، وە ابن أبي ملیكة.

دوای ئەو چینەی سەرەوە هەر لە نێو ئەهلی مکەدا کۆمەڵێک پێشەوایی پێشەنگی تر و دیار ئەوانیش:

عمرو بن دینار، وعبد الله بن طاوس، وەابن جريج، ونافع بن عمر الجمحي، وسفيان بن عيينة، وفضيل بن عياض، ومحمد بن مسلم الطائفي، ويحيى بن سليم الطايفي، وە أبو عبد الله محمد بن إدريس الشافعي کە یەکێکە لەدیارترین پێشەوا و پێشەنگانی سەلەف لەدوای تابعین ، ئینجا عبد الله بن يزيد المقري، وەعبد الله بن الزبير الحميدي - رضي الله عنهم أجمعين.

## لەزاناو پێشەوایانی ئەهلی شام جەزیرە:

کۆمەڵێک زانای دیار و پێشەنگی تابعین کەلە شام هەبوون لەنێو دیار ترینیان بریتی بوو لە:

عبد الله بن محيريز، وە رجاء بن حيوة، وەعبادة بن نسي، وەميمون بن مهران، وەعبد الكريم بن مالك الجزري.

ئینجا دوای ئەوان لە گەورە ئەتباعی تابعیندا:

عبد الرحمن بن عمرو الأوزاعي کە مشهور بوو بە ئیمامی ئەهل الشام یەکێک بوو لە دیار ترین پێشەنگ و پێشەوایانی خير القرون لەو کات ، وە محمد بن الوليد الزبيدي، وەسعيد بن عبد العزيز التنوخي، وعبد الرحمن بن يزيد بن جابر، وعبد الله بن شوذب، وأبو إسحاق إبراهيم بن محمد الفزاري.

ئینجا لەدوای ئەوان:

أبو مسهر عبد الأعلى بن مسهر الدمشقي، وەهشام بن عمار الدمشقي، وەمحمد بن سليمان المصيصي ناسراو بە بلوين.

ئەوانە پێشەواو سەرمەشقی ئەهلی شام و جەزیرە بوون جگە لەوان کەسانی تر ی عابد و زاهد هەبون.

## لە زاناو پێشەنگانی ئەهلی کوفە لە تابعین بریتی بوون لە:

علقمة بن قيس کە قوتابعی ابن مسعود بوو ، وەعامر بن شراحيل الشعبي يەکێکە لە ديار ترين پێشەوايانی تابعين لە علم و زوهد و ورع دا ، وە أبو البختري سعيد بن فيروز، وإبراهيم بن يزيد النخعي، وە طلحة بنمصرف، وزبيد بن الحارث، والحكم بن عتيبة، ومالك بن مغول، وەأبو حيان يحيى بن سعيد التيمي، وەعبد الملك بن أبجر، وەحمزة بن حبيب الزيات المقري، ثم محمد بن عبد الرحمن بن أبي ليلى،

ئينجا لە نێو گەورە پێشەنگ وپێشەوايانی( أتباع التابعين ) دوای ئەوان **هەر لە كوفەدا بريتی بوون لە:**

سفيان الثوري كە لێرەدا وەسف ناكرێ چونكە لەلووتكەی علم و ورع و زوهد دا بوو بەجۆرێک بۆتە سەر مەشقی ئەهلی كوفە وە شريك بن عبد الله القاضي، وە زايدة بنقدامة، وەأبو بكر بن عياش، وەعبد الله بن إدريس، وعبد الرحمن بن محمد المحاربي، ويحيى بن عبد الملك بن أبي غنية، وە وكيع بن الجراح، ئيمامی وە كيع بەهەمان شێوە قوتابی پێشەوا سفيان بوو وأبو أسامة حماد بن أسامة، وجعفر بن عون، ومحمد بن عبيد الطنافس، وەأبو نعيم الفضل بن دكين شێخی ئيمام بخاريە.

ئەوانە كۆمەڵێك پێشەوای دياری ئەهلی كوفە بوون لە چينی خی القرون دا جگە لەوانەش زۆری تر هەبوون بەڵام ئەمانە ديار ترينيان بوون.

## له زاناو پێشەوایانی التابعین لە ئەهلی بەصرە دا:

دیارترین و ناودار ترین پێشەواو پێشەنگانی خیر القرون لە تابعین لە شاری بەسرِدا بریتی بوون لە:

أبو العالیة رفیع بن مهران الریاحي یەکێک لە پێشەوا دیارەکان بە بەشێکی تایبەت لە کتابی ( عیبادەتی خیر القرون ) باسم کردووە .، وە الحسن بن أبي الحسن البصري کە دیارترین ئیمامەکانی تابعینە لەو کاتدا لە لووتکەی علم و زوهد دا بوو بەهەمان شێوەی أبو العالیة باسم کردووە بەدرێژی لە شوێنی تر  وە محمد بن سیرین، پێشەوا لە حدیث لە فقهـ لە عەقیدە

وە أبو قلابة عبد الله بن زید الجرمي.

ئەوانە دیارترین ئیمامەکانی خەڵکی بەسرە بوون لە نێو تابعیندا

## ئینجا دوای ئەوان لە پێشەوا پێشەنگانی گەورە أتباع التابعین:

أبو بکر أیوب بن أبي تمیمة السختیاني ، وەیونس بن عبید، وەعبد الله بن عون، وەسلیمان التیمي، وەأبو عمرو بن العلاء، وەحماد بن سلمة، وە حماد بن زید.

ئینجا دوای ئەوان:

یحیی بنسعید القطان، وەمعاذ بن معاذ، ثم عبد الرحمن بن مهدي، وە وهب بن جریر، وەأبو الحسن علي بن عبد الله بن جعفر المدیني، وەعباس بن عبد العظیم العنبري، ومحمد بن بشار، وسهل بن عبد الله التستري.

## له زاناو پێشەوایانی ئەهلی خوراسان بریتی لە:

أبو عبد الرحمن عبد الله بن المبارك المروزي ، ابن المبارك يەكێك لە ديارترين و پێشەنگ ترين زانايانی أتباعی تابعين قوتابی سفيان بوو وەک زانايان لەوەسفی دەڵێن هەرچی سيفەتی چاكە لە و پێشەوايەدا كۆبوتەوە عابد و عالم و مجاهد بوو ،

، وە الفضل بن موسى السيناني، وەالنضر بن محمد المروزي، والنضر بن شميل المازني، ونعيم بن حماد المروزي ، نعيم شێخی ئيمام بخاريە خاوەنی كتابی ( الفتن ) بەهۆی محنەتی خەلقی قورئان تووشی زيندان بوو وە هەر بەو هۆيەوە شەهيد بوو ، وإسحاق بن إبراهيم بن مخلد المعروف بابن راهويه المروزي، ئيسحاق شێخی زۆرێک لە پێشەوايانی كتب الستة يە هەر ئەويش بووە هۆی پاڵنەری سەرەكی ئيمام بخاري تاوەكو كتابی صحيح البخاري بنوسێت لەديار ترين ئيمامەكانە بەجۆرێک لە فقهـ و حەديث و عەقيدە لە زۆربەی بابەكان ئيسحاق دەوری هەبووە . وەأحمد بن سيار المروزي، وەمحمد بن نصر المروزي، وە يحيى بن يحيى النيسابوري، ومحمدبن يحيى الذهلي،شێخی خوراسان و شێخی ئيمام بخاري و مسلم و ئەوانی تر الذهبي دەڵێت: هاوشێوەی ئيمام ئەحمد بووە لە ئيمامەتی خوراسان.

## ئينجا دوای ئەوان و قوتابيەكانيان دێن كە لەنێو دارترينيان : بريتی بوون لە

محمد بن إسماعيل البخاري، ئيمامی البخاري پێويست بە وەسف و ناساندن ناكات چونكە زۆرينەی ئوممەی ئيسلام بە بچووك وگەورەوە دەيناسێت ، وە یعقوب بن سفيان الفسوي، وأبو داود سليمان بن الأشعث السجستاني دانيشتووی البصرة، وە أبو عبد الرحمن النسوي، وەأبو عيسى محمد بن عيسى الترمذي، ومحمد بن إسحاق بن خزيمة، ومحمد بن عقيل البلخي.

ئەوانە دیارترین پێشەوایانی ئەهلی خوراسان بوون لە چینی أتباع التابعین دا نەك تابعین وە بەشێک لە قوتابیەکانیان چونکە خیر القرون سێ چین دەگرێتەوە بەڵام قوتابیەکانیان کەوا نزیکن لەو سەردەم پێویستە بناسرێن لەبەر ئەوەی دەورێکی کاریگەریان هەبووە لە دینی ئیسلامدا.

## وە لە نێو پێشەوایانی سەلەف نەك خیر القرون لە ئەهلی الري دیارترین یان بریتی بوون لە:

إبراهیم بن موسى الفراء، وأبو زرعة عبید الله بن عبد الكریم الرازي، وأبو حاتم محمد بن إدریس الحنظلي، وأبو عبید الله محمد بن مسلم بن وارة، وأبو مسعود أحمد بن الفرات نزیل أصبهان.

## لە زاناو پێشەوایانی سەلەف لە بەغداد بریتی بوون لە:

أبو عبد الله أحمد بن محمد بن حنبل ئیمامی ئەحمد یەکێک لە ئەستێرە گەش و دیارەکانی سەلەف و قوتابی أتباع التابعین وە دیارترین و کاریگەر ترین ئیمام لە دوای هاوەڵان لەسەر ئوممەی ئیسلام دا لە تێکڕای زانستەکانی دیندا پێشەنگە و پێکاو ترین ڕەئی هەیە لە دیندا و نزیکترینانە لە صواب ،وە أبو زكریا یحیى بن معین، ئیمامی ابن معین بە ئیمامی ( الجرح والتعدیل ) ناسراوە ئەو کەسەی لە بواری زانستەکانی حەدیسدا کاردەکات زۆر ترین ناو کە دووبارە بێتەوە لای ئەو ئیمامەیە هێندە دەورێکی باڵای هەبووە لەو زانستە دا وە أبو عبید القاسم بن سلام، وە أبو ثور إبراهیم بن خالدالكلبي، وأبو خیثمة زهیر بن حرب، وەالحسن بن الصباح البزار، وەأحمد بن إبراهیم الدورقي، ومحمد بن جریر الطبري، وأحمد بن سلمان النجاد الفقیه، وأبو بكر محمد بن الحسن النقاش المقري.

ئەوانە لە دیار ترین و کاریگەر ترین پێشەوایانی ئەهلی بەغدا بوون لە سەلەف وە هەندێکیان لە أتباع التابعينن.

# وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

# پێڕست